سرشناسه: فلاحی رستمان، مهدی
پدیدآور: چریکەی دڵ، مەهدی فەللاحی ڕۆستەمان «سەرمەس»
مشخصات نشر: سەقز، انتشارات خانی، ۱۳۹۸
مشخصات ظاهری: ۴۳ ص ۲۱×۱۳ س‌م.
شابک: ۹۷۸_۶۲۲_۹۹۲۳۲_۸_۳
وضعیت فهرستنویسی: فیپا
یادداشت: کردی
موضوع: شعر کردی - قرن ۱۴
موضوع: Kurdish poetry - ۲۰th Century
رده بندی کنگره: PIR ۳۲۵۶
رده بندی دیویی: ۸فا۹/۲۱
شماره کتابشناسی ملی: ۵۶۹۳۵۵۰



# چریکەی دڵ

مەهدی فەللاحی ڕۆستەمان «سەرمەس»
ساڵ و نۆرەی چاپ: ۱۳۹۸ ـ یەکەم
تیراژ: ۳۰۰
شابەک: ۹۷۸_۶۲۲_۹۹۲۳۲_۸_۳
دەزگای چاپ: خانی
پیتچن و پەرازین: ئومید موقەددەس
ڕووبەرگ: لوقمان عەلیوەیسە

سەقز، مەیدانی هەڵۆ، چاپەمەنی خانی، کتێبفرۆشی هونەر و ئەندیشە
پێوەندی: ۰۰۹۸۹۱۸۷۷۷۱۵۸۵
www.kurdbook.ir

## پێشەکی

من وەکوو هێندێک لەو نووسەرانە و شاعێرانە نییم شانی لێ شل بکەم و هەموو ژیانی خۆم لە پێشەکی کتێبەکەمدا بنووسم. سەبارەت بە من «مەهدی فەللاحی ڕۆستەمان» ناسراو بە «سەرمەس»، ٢٣ ساڵم تەمەنە و خەڵکی ساحێبی نزیکی سەقزم و لە پارێزگای کوردستانی ئێران دەژیم. هەر لە منداڵیەوە خولیای شێعر و ئەدەبی کوردی بووم. ئەم «چریکەی دڵ»ـەیش وەک بەرهەم، دووهەم بەرهەمی منە کە وا ئێستە لەبەر دەستی ئێوەی خوێنەرانی هێژایە.

سەبارەت بە دووبەیتی

دووبەیتی، ڕوباعی یان quartrain یەکێکە لە قاڵبی شێعری سوننەتی فارسی کە لەگەڵ چوارینەدا جیا کراوەتەوە و دوو فۆرمی جیاوازن بەڵام بەداخەوە پاش تێپەڕینی دەیان ساڵ لە ئەدەبی کوردیدا هێشتا دووبەیتی و چوارینە لێک جیا نەکراونەتەوە و بە هەردوو فۆرمەکە هەر چوارینە یا چوارخشتەکی دەڵێن. چوارینە لە ئەدەبی فارس‌دا لەسەر کێشی دوازدە بڕگەیی و دووبەیتی یازدە بڕگەیی و هەندێ جار مەوزوون و بابەت و ناوەرۆک گۆڕانکاری بەسەردا دەهێنێت. دووبەیتی لە مێژووی ئەدەبی ئێراندا زۆر بایەخی پێدراوە، هەر بۆیە زۆربەی شاعیرە فارسەکان لەم قاڵبەدا شێعریان نووسیوە و زۆریش

لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا ئەنجام دراوە. بەنـاو بـانگترینی ئـەم دووبـەیتی فارسـییانە، عـەتتـاری نـەیشـابووری، مـەنـووچێهری دامغـانی، ئەبولحەسەنی باخزری و بابا تاهێری هەمەدانی نووسیویانە و زۆریش بـەنـاو بـانگن. هـەر بۆیـە بـە زۆربـەی زمانـە زینـدووەکـانی دنیـا وەرگێـڕدراوەتـەوە. خـەییـامی نـەیشـابووری و هـاتێفی ئیسـفەهـانی جیاوازترین و جـوانترین دووبـەیتی فارسـییان هۆنیـوەتـەوە و کێشـی دووبەیتییەکانیان لە هەموو کەسـانی تـر جیـاوازترە و تایبـەتمـەنـدی خۆیانیان هەیە.

ئەگەرچی ئەم قاڵبە شێعریە تایبەت بە فارس بووە، بـەڵام هـەر لـە ناو فارسدا نەماوەتەوە و لە ناو کوردانیش دا باو بووە، زۆر لـە شـاعێرە گەورەکانی کوردیش وەک : حەزرەتی مەحوی، حەریـق، حـەمـدی، هەژار، هێمن، جەلالی مەلەکشا، ئـەحمـەد هـەردی و زۆری تـر لـە شاعیرانی سەردەم لەم کێش و فۆرمەدا شێعریان نوسیوە، بـەڵام وەک چۆن لەناو شاعێرە فارسەکاندا خەییام و هاتێف بەناوبـانگن، لـە نـاو شاعێرە کوردەکانیشدا مامۆستا هەژاری موکریانی لە هەموو شاعێرانی تر ناوبانگی بەرزترە و چوارینەکانی جیاوازتر و تایبەتمەندترە.

دووبەیتی لە چوار نیوە دێڕ پێک دێ کە نیوە دێڕەکانی یـەک و دوو و چوار هاوسەنگن و لە باری کێش و بەشەوە (هجا) بەرانبەرن بـەڵام جاری وا هەیە لە نیوە دێڕی سێهەم دا ئەم مەرجانە پارێزراو نییە.

ئەوەی لەبەر دەستدایە:

ئەوەی لە بەر دەستی ئێوەی هێژایە، هەڵقوڵاوی هەستی لاویـەتـی منی «سەرمەس»ـە کە لە قاڵبی چوارینەدا خۆی نیشان داوە.

سەرەتای ئەم کتێبە چەن دووبەیتی‌یەک بوو کە لە کاتی پشووداندا نووسیبووم بەڵام کاتێ وردتر سەرنجی دووبەیتیەکانم دەدا زانیم ئەم چوارینانە دەتوانن کتێبێکی سەربەخۆ بن و لەناو کۆمەڵگای ئەدەبیدا جێی خۆی بکاتەوە؛ هەر بۆیە بایەخی زیاترم بە چوارینە نووسین دا و توانیم ئەم بەرهەمە پێشکەشی کتێبخانەی ئەدەبی کوردی بکەم.

ئەگەر چی کەس بە ماستی خۆی ناڵێ ترش! منیش ئەم «چریکەی دڵ»ـە بە خراپ نازانم و هیوادارم ئێوەی خوێنەریش بە دڵتان بێت.

لێرەدا جێگەی خۆیەتی هەوڵ و تێکۆشانی مامۆستای بەڕێزم لوقمانی ئەڵڵامورادی لەبەر چاو بگرم و بە دڵ سپاسی بکەم کە وێڕای سەرقاڵیەکانی خۆی بەم کتێبەدا چووەتەوە. بەهیوای سەرکەوتنی و تەمەن درێژی بۆ مامۆستا لوقمانی خۆشەویست.

مەهدی فەللاحی ڕۆستەمان ـ «سەرمەس»

ساحێب

١٧ی ڕێبەندانی ٢٧١٤ی کوردی

سەرەتای ئەم کتێبە چەن دووبەیتی‌یەک بوو کە لە کاتی پشووداندا نووسیبووم بـەڵام کاتێ وردتر سەرنجی دووبەیتیەکانم دەدا زانیم ئـەم چوارینانە دەتوانن کتێبێکی سەربەخۆ بن و لەناو کۆمەڵگای ئـەدەبیـدا جێی خۆی بکاتەوە؛ هەر بۆیە بایەخی زیاترم بـە چوارینـە نووسـین دا و توانیم ئەم بەرهەمە پێشکەشی کتێبخانەی ئەدەبی کوردی بکەم.

ئەگەر چی کەس بە ماستی خۆی نالێ ترش‌ا منـیش ئـەم «چریکـەی دڵ»ـە بە خراپ نازانم و هیوادارم نیوەی خوێنەریش بە دڵتان بێت.

لێرەدا جێگەی خۆیەتی هـەوڵ و تێکۆشـانی مامۆسـتای بـەڕێـزم لوقمانی ئەڵڵامورادی لەبەر چاو بگرم و بە دڵ سپاسی بکەم کە وێڕای سەرقاڵیەکانی خۆی بەم کتێبەدا چووەتەوە. بەهیـوای سـەرکـەوتنـی و تەمەن درێژی بۆ مامۆستا لوقمانی خۆشەویست.

مەهدی فەللاحی رۆستەمان ـ «سەرمەس»

ساحێب

١٧ی ڕێبەندانی ٢٧١٤ی کوردی

.١

ئەوەنــــدەم خـــەم لــــە دووری تــــۆ چنیـــوە
خەفـەت، مـەینـەت، هـەمـوو دڵمـی تـەنیـوە
بڵێـــی شـــادی هـــەبێ لـــەم ژینـــە تاڵـــە؟؟
بـــە غـــەیـــری ڕەنجـــەڕۆییم قـــەت نـــەدیـــوە

.٢

کـــە دەردی مـــن وەکـــوو ســـیلدار گرانـــە
مژینـــی لێـــوی تـــۆش دەرمانـــە، گیانـــە
شـــفام دێ هـــەر وەکـــوو عیســـا ببینـــم
وەرە ئـــەمڕۆ کـــە هـــەیـــن ســـۆزی نـــەمانـــە

.٣

لـــە کـــاتی مردنـــا بێـــرە ســـەریـــنم
بـــە دەنگـــی خـــۆش بکـــە گریـــان و شـــینم
بـــە قـــەد دنیـــا ئەگـــەر تـــاوانی مـــن بـــێ
شـــەهیدم چونکـــە کـــوژراوی ئـــەویـــنم

.٤

بـــەهاری ســـەوزی ژینـــی مـــن بـــەتاڵـــە
درێژایـــــی تەمـــــەن، زســـــتانە، تاڵـــــە
بـــە مـــردن مـــەر لـــە ئـــەم ســـەرمایە هـــەڵبێم
کـــەچـــی گـــەردوون ئـــەڵـــێ منداڵـــە، کاڵـــە

.٥

بەڵێن بوو مەرگ و ژینمان پێکەوە بێ
دەسا بۆچی بەڵێنت نەچوەتە جێ؟؟
بەسەرخۆشی ببە سەر ڕۆژگارت
هەتا ئەو ڕۆژە وا مەحشەر دەفەومێ

.٦

موریدی تۆم لە دنیا تا بمێنم
لە بەر تۆدا نەبێ سەر نانوێنم
پڕی دنیا کچۆڵەی نەرم و نۆڵ بێ
بە چاوی تۆ گوڵم کەس نادوێنم

:٧

ژیانم بەر لە تۆ پڕ بوو لە خۆشی
سەرت هەڵدا خەم و زووخاوی نۆشی
دڵم زنجیری داوی بسکی تۆیە
ئەتۆیش بۆ دڵبەری خۆت تێ دەکۆشی

.٨

ژیانی من هەمووی شین و شەپۆڕە
سەری بسکی خەمانم بەرز و شۆڕە
چییە سووچ و گوناهی من خودایە
کە خۆشی و پێکەنین لێم مرج و مۆڕە

.٩

گـــوڵم ڕەنگـــم وەکـــوو بـــەی زەردە بـــێ تـــۆ
جـەرگ لـەت لـەت، لـەشـم پـڕ دەردە بـێ تـۆ
بـــە مـــن چـــی کۆشـــک و تـــالاری بلـــوورین
منـــی «بێچـــارە» جێگـــەم هـــەردە بـــێ تـــۆ

.١٠

ئەمـە ن ڕۆیـی بـە بـێ هـۆ هـەر لـە دووی تـۆم
منـــی «بێچـــارە» ئـــاوارەی کـــەژ و کـــۆم
چییـــە بـــۆچی نییـــە ڕەحمـــت لـــە گـــەڵ مـــن
وەرە جارێـــک بـــە لوتفـــت بێـــرە ژوان بـــۆم

.١١

بـــەهـــاری ژینـــی مـــن بـــێ تـــۆ خـــەزانـــە
لـــە گـــەڵ تـــۆدا خـــەزانیشـــم ژیانـــە
لـــە ئـــاهی ســـەردی نـــاو ســـینەم بترســـە
وەرە بـــا دەس لـــە مـــل بـــین ئـــەم دەمانـــە

.١٢

هـــەموو عـــومرم لـــە دووریـــت چـــوو بـــەزایـــە
شـــنەی بســـکت دڵـــی خســـتوومە کایـــە
وەرە بنوێنـــە ئـــەو نەرمـــە لەشـــەی خـــۆت
کـــە بـــۆ دەردی گرانـــی مـــن دەوایـــە

.١٣

ئەگەرمــەیلــت هــەبێ وەک جــاری جــاران
بـــە دڵ خۆشـــی بچینـــە کـــۆڕی یـــاران
هــەتــا کــەنگێ بنۆشــین دەرەد ومــەینــەت
کـــە وا مەینـــەت هـــەموو دڵمـــانی تـــاران

.١٤

لـــە دووریـــت تاقـــەت و هێـــزم نـــەمـــاوە
نـــەمـــامی لاوی عـــومرم تێـــک شـــکاوە
بـــە وێنـــەی سیـــە غونچـــە وا بـــە ڕووی تـــۆ
گەشـــەم دێ مـــن کـــە ڕووی تـــۆ وەک هـــەتـــاوە

.١٥

بـــە عـــومرم بـــێ وەفـــای وەک تـــۆم نـــەدیـــوە
لـــە داخـــی بـــێ وەفاییـــت ســـینگ دڕیـــوە
ئەوینـــداری وەکـــوو مـــن کـــوا لـــە دنیـــا
قـــەلـــی «بێچـــارە»یـــی بـــۆمن قڕیـــوە

.١٦

وەکـــوو خاڵـــت ڕەش و تاریکـــە ژیـــنم
بـــە موژگانـــت دڵ و لـــەش پـــڕ بـــرینم
ئەگـــەر تـــک تـــک لـــە جـــەرگـــم خـــوێن بچـــۆڕێ
نییـــە بـــاکم کـــە سەرمەســـتی ئـــەویـــنم

.١٧

برینــــی مـــن بـــه ســـۆیه بـــۆت وەرە دەی
دڵــی «بێچــارە» ســـووتان ســا هــەتا کــەی؟؟
برینــــی مـــن بـــه ئاســـان دێتـــه ســـارێژ
ئەگـــەر بێبـــەش نـــەبم گیانـــه لـــه دوو بـــەی

.١٨

بـــه عیشـــوە پێـــی وتـــم: دەم بـــه کـــەنیـــنم
کـــه ئـــاوا تـــۆ بـــه غـــەمباری نـــەبیـــنم
دەســـا گـــەر دڵ پـــەرۆشـــیم شـــادی تۆیـــه
دەبـــا پڕبـــڕ لـــه خـــوێ بـــێ گشـــت بـــرینم

.١٩

وەکـــوو مـــەجنوون لـــه داخـــی لـــەیـــل لـــه کێـــوم
شـــەو و ڕۆژ چـــۆڵ و دەشـــت و دەر نـــەپێـــوم
بـــەرەو ڕووی تـــۆ نـــزای مـــن هـــەر وەهایـــه:
شـــەرابی هـــەردوو گۆناکـــەت بـــه لێـــوم

.٢٠

لــــه داخــــی دووری تۆیـــه زەردە ڕەنگـــم
لـــه بـــێ مـــەیلیـــت گـــوڵم دڵ پـــڕ لـــه ژەنگـــم
ئەگـــەر دنیـــام لەســـەر تـــۆ بـــێ بـــه دوژمـــن
بـــه چاوانـــت قـــەســـەم مایـــل بـــه جـــەنگـــم

.٢١

مــژۆڵ و چــاوی ڕەشــت و بــسکی خــاوت
منـــی «بێچـــارە» یـــان خســـتوەتـــە داوت
هـــەموو عالـــەم بکـــەن لۆمـــەم چ باکـــە؟؟
هـــەموو دونیـــا دەهێنـــێ لام دوو چـــاوت

.٢٢

منێکـــی شـــێت و دێوانـــە و ئـــەوینـــدار
بـــە تیـــری چـــاوەکانـــت دڵ برینـــدار
لـــە دووری تـــۆ هـــەموو ســـاتم نـــەمانـــە
چ خۆشـــە مـــردنم بـــا بچمـــە ســـەر دار

.٢٣

بـــە قوربانـــت دڵ و گیـــان و ســـەر و لـــەش
لـە بـۆت سـووتام، نـەماوە یـاری چـاو گـەش
هـەموو عالـەم لـە گـۆمی هـەش نوقـووم بـوون
دەســا بــا بــێ بــە قوربانــت لەشــی مــەش

.٢٤

وەرە ســـــاقی وەرە ســـــاقی وەرە دەی
وەرە بــۆم تێکــە لــەو بــادە پــەیــا پــەی
بــە بــادە مــەر خــەم و دەردم وە ڕاونــێم
بـــژیم و پێکـــەنێم و بشـــلێم ئۆخـــەی

.٢٥

هەتاکەی تەفرەدان ئەی ماڵت ئاوا
لە بێ مەیلیت ئەمەن ڕۆیی بە ئاوا
بە بێ تۆ کۆشکی ژینی من چ تارە
بە ماهی ڕووت ژیانی من کە ئاوا

.٢٦

لە دووری بەژن و باڵات کوێرە زەینم
کە تۆراوی براوە کەین و بەینم
گوڵم بێ مەیلیەکەی تۆ کوشتمی سا
بە ئۆباڵت گوڵی خۆم، خوێن و دەینم

.٢٧

بە بۆنت سووسەنم «سەرمەس»ت و شێتم
نەماوم گیانەکەم وەک تۆزی پێتم
لە بۆ «بێچارە» گش دنیای گوڵی شۆخ
بڵێ ئۆخوا ئەمن بۆتۆ کە کێتم؟؟

.٢٨

هەتا کەی من بچێژم دەردی دووری
دڵم نەیماوە هیچ هێزی سەبووری
گوڵم ناکەی دەڵێی سەبر و سەبرکە
ئەتۆ بۆ خۆت ئەوەندەی من سەبووری؟؟

.٢٩

ئـــەمن دەردم گـــران، تـــۆیش شـــادمانی
بـــە دەردی ئـــەم دڵـــەت هـــیچ کـــات نـــەزانی
چ ســـرێکە لـــە بـــەینـــی ئـــەمن و تـــۆدا
بـــە دڵ خۆشـــیم ئـــەتۆ بـــۆ دڵ گرانـــی؟؟

.٣٠

لـــە چـــارەم وایـــە داری بـــێ ســـەمەر بـــم
بنـــاڵێنم، دەوام هەردەربـــەدەر بـــم
ئەگـــەر ڕۆژێـــک نـــەبم کۆرپـــەم هـــەتیون
ئـــەبێ مـــن بـــابی گشـــت دەرد و کەســـەر بـــم

.٣١

ژیـــانم بـــۆ دەبـــێ هـــەردەرد و خـــەم بـــێ؟؟
خەفـــەت بـــاران و هـــەر ئـــاوم لـــە چـــەم بـــێ؟؟
بـــە ئـــاوی چـــەم درووس بـــوو دووهـــەزار چـــەم
شـــەپۆلی چـــەم هەتاکـــەی چـــاو لـــە چـــەم بـــێ؟!

.٣٢

ئـــەناڵێنم لـــە دووری بەژنـــەکـــەی تـــۆ
وەکوو مـــن قـــەیســـی مـــەجنوون کـــەی گـــەڕا کـــۆ
گـــڕی زۆر بـــەرزە بـــۆ وەســـڵت دڵـــی مـــن
هەتاکـــەی دڵ بســـووتێ و هـــەر بکـــا ڕۆ؟؟

.٣٣

لــــه هیجـــری تۆیــــه مـــن جـــەرگم بــڕاوه
نییــــه ئــــۆقره و دڵئـــــارامی نــــەماوه
کــــه لــێم دووری وەکــــوو شــــەو تــــاره ڕۆژم
وەره ڕوخســـارەکـــەت چەشـــنی هـــەتاوه

.٣٤

لــــه هیجـــری تـــۆ خـــەم و دەردم خەڵاتــــه
چ دەردی مـــــن چ دەرمـــــانم لـــــه لاتــــه
هەتاکـــەی مـــن بچێـــژم زووخـــی دۆزەخ
وەره وەســـڵت وەکــــوو جێژنــــی بەراتــــه

.٣٥

ئـــــەناڵێنم لەدەســـــتی دەردی کــــــاری
دڵـــم بــــۆچی بــــه تــــەنیا دەردە بــــاری
لــــه بــــۆ «بێچــــاره» هـــیچ هیـــوا نـــەماوه
مەگـــەر ڕەحمـــی جـــەنابی زاتـــی بـــاری

.٣٦

ئـــەناڵێنم لـــــه دەس ئـــــەم دەرده ســــەخته
خـــەتای هـــیچ کـــەس نییـــه ناڵـــەم لـــه بەختـــه
هـــەموو خۆشـــی دەبـــێ بـــۆ فـــەرز و فـــەرز بـــێ
بـــەڵام دەرد و کەســـەر بـــۆچ پوخـــت و نەختـــه

.٣٧

دەکـــا ناڵـــە لـــە دەردی عیشـــقی تـــۆ دڵ
وەکـــوو مـــەجنوون بـــوە ئامێتـــەیـــی گـــڵ
ئەگـــەر دەردی فیـــراق وایـــە خودایـــە
دەبـــێ چـــۆن بـــێ دڵـــێ دەربـــێ لـــەنێو کـــڵ

.٣٨

لـــە مێـــژە ئـــەم دڵـــەم جێژوانـــی دەردە
هەناســـەم وەک تـــەمی ســـەرکێوە، ســـەردە
بەغـــەیـــری ئـــاوی چـــاوی پـــڕ کـــوڵی خـــۆم
نییـــە کـــەس پێـــی بڵـــێ «بێچـــارە» بـــەردە

.٣٩

دەبیـــسم نـــاوەکـــەت سەرمەســـت و شـــادم
هـــەموو دەڕوا خـــەم و مـــەینـــەت لـــە یـــادم
بەغـــەیـــری نـــاوی تـــۆ گـــەر دێتـــە بـــەر گـــوێم
بـــە وێنـــەی کاکـــە مـــەم بـــۆت نـــامورادم

.٤٠

منـــــی عاشـــــق ئـــــەناڵێنم ژەم و دەم
هـــەموو عالـــەم بـــە کـــەیفـــە و کـــەیفی مـــن کـــەم
کـــەمی چـــی؛ مـــن ژیـــانم پـــڕ لـــە دەردە
خودایـــا هـــەر لـــەبیرت مـــاوە مـــن هـــەم؟؟

.٤١

کە ڕۆحی من لە ڕێی تۆدا شەهیدە
مەڵێ شێتە، بڵێ زانا و موریدە
ئەگەر جارێک بفەرمووی بۆ سەراکەم
هەمووی خاوێن دەکەم بەو ئاوی دیدە

.٤٢

قەل و بولبول بە خوێندن چوونە بازار
وتیان: قەل دەنگی تۆ پڕ بوو لە ئازار
کە گۆیا بولبولە دەنگ‌خۆش و «سەرمەس»ت
کەچی سەربەستە قەل بولبول گرفتار

.٤٣

ئەگەرچی دیلم و پڕ ئاهی ساردم
بە کەیفم چون سڵاوت بۆ هەناردم
ئەگەر ڕۆژێک بەیادی تۆ نەنووم شەو
پەنیرە پێکەنین، من چەشنی کاردم

.٤٤

بەهارە و دەشت و کۆ شینە هەموو دەم
گەلی یاران دەڕۆن بۆگەشت بەبێ خەم
منی سەرشێت و «بێچارە» و پەشێو حاڵ
بە ئاوانم لە دوور سەیرێکی تۆکەم

.٤٥

دەکـــەی جن جـــن دڵـــم وەک نەشـــتەری تیـــژ
لـــە دووری تۆیـــە مـــن مـــاوم گـــەڵێ گیـــژ
وەرە لـــەیلـــم ئـــەمن مەجنوونـــەکـــەی تـــۆم
هەتاکـــەی وێڵـــی کێـــو بـــم شـــۆخی خـــوێنڕێژ

.٤٦

هـــەموو ڕۆژی ژیـــانم تـــارە وەک شـــەو
شـــەویش قـــەت ناکـــەوێ لـــەو دووچـــەمم خـــەو
دڵـــە «بێچـــارە»کـــەم وێڵـــی کـــەژ و کـــۆ
لـــەبن بـــەردان ئەقاســـپێنێ وەکـــوو کـــەو

.٤٧

هـــەموو عـــومرم بـــە چـــاوت چـــوو بـــە زایـــە
دڵـــم، گیـــانم لـــە ڕێـــی تـــۆدا فەنایـــە
ئـــەوەی فـــەرمووت بـــەجێم هێنـــا ســـەراپا
کـــە حـــوکمی تـــۆ لـــە لای مـــن زۆر ڕەوایـــە

.٤٨

هـــەموو ڕۆژم شـــەوی تـــارە بـــەبێ تـــۆ
شـــەکـــر، هـــەنگوین وەکـــوو ژارە بـــەبێ تـــۆ
کـــە دنیـــا پـــڕ لـــە خۆشـــیش بـــێ بـــە من چـــی
دڵـــم دیـــل و گرفتـــارە بـــەبێ تـــۆ

.٤٩

گوڵم بوونت لەبۆم هێزی هەناوە
وەرە شەوقی ڕوخت چەشنی هەتاوە
خودا فەرمووی قیامەت هالەڕێدا
لە هیجری تۆ قیامەت لێم گەڕاوە

.٥٠

تەم و تاریک و تاڵە ئەم ژیانە
ژیانی من بەبێ تۆ هەرنەمانە
ژیان کورتە، دەم و سات دێت و دەڕوا
بنێ دەم، دەم کە خۆشە ئەم دەمانە

.٥١

ژیانی من بەبێ تۆ چی خەڵاتە؟؟
هەموو کەیفی ژیانی من لە لاتە!
ژەم و دەم هەر لە بیری تۆم گوڵی خۆم
بڵێ تۆخوا کە بیری من لە لاتە؟؟

.٥٢

لە کێوی عەشقی تۆدا هەرمنم قەیس
خەفەت بارم بە وێنەی حەزرەتی شەیس
لە کۆڕی شین و ماتەمدا وەرەس بووم
ئیدی ناکەی بە من ناگا بزە و لەبس[1]؟؟

---

١- لەبس: هەڵپەڕین، سەما، گاڵتە و گەمە.

.٥٣

لــــه بـــۆ وەســـــفت زمـــــانی خامــــه لاڵــــه
چلــــۆن بیکـــــەم وەســـف ئـــەو چــاوە کاڵــــه
ئەگـــەر بمـــــداتێ یــــەزدان عـــومری نـــووحیش
بـــه یـــەک بـــوونی مــــن و تــــۆ زۆر مەحاڵــــه

.٥٤

ئـــەوەی وا ئـــەو گوڵــــه ناســـکەی لــــه لایــــه
لــــــەڕەی لیمــــۆی دڵــــــی دێنێتـــــه کایــــــه
بنـــــــاڵێنێ و بکـــــــا هـــــــاوار دڕۆیــــــــه
ئـــەوەی وا کـــــه لــــه تــــۆ دوور بـــێ فەنایــــه

.٥٥

دڵـــــــی کــــــەیلم لەبـــــەر تۆیــــه هــــــەژاره
لــــه پــــڕ پۆشـــی جـــــل و بـــــەرگی پـــــەژاره
کـــــەنین بـــــێ تــــۆ بچێتـــــه خـــــوانی لێـــــوم
بزانـــــه پێکـــــــەنینم گشـــــــت بـــــــه ژاره

.٥٦

بـــــەبێ تـــــۆ چـــــۆن بـــــژیم و چـــــۆن بمێـــــنم
بـــــەبێ تـــــو چـــــۆن ســـــەری شـــــادی هـــــەڵێنم
لـــه دووی بـــــاڵات نــــەکــــەم بـــــۆنی گـــــوڵی دی
بڵێـــــــنم داوە، مــــــــن خـــــــاوەن بڵێـــــــنم

.٥٧

گلێنەی چاوەکەم، هات جێژنی قوربان
سەر و ماڵ و دڵ و گیانم بە قوربان
چییە بەم ڕۆژی جێژنەش عاجزی لێم؟؟
لە ڕەحم و گەورەیی تۆ دوورە قوربان

.٥٨

وەرە ساقی لە بۆم تێکە بە پەیمان
بە ناچاری شکاندم عەهد و پەیمان
ئەمن هەرچەن دەکەم دووربم لە مەینەت
بەڵام مەینەت پەیاپەی دێ لە پەیمان

.٥٩

لە دووری تۆ دڵ و گیانم لە دەستچوون
ئەتۆ لەیلی، منی «بێچارە» مەجنوون
ئەمن بۆ تۆ دڵ و گیانم لە دەس چوو
ئەفەرمووی جا بە من چی با بچێ، توون

.٦٠

کە تۆ ئەمڕۆ لە من تۆراوی ئازیز
خەزانم کرد بە وێنەی بەرگی پاییز
دڵ و گیان و ژیانم پاکی بڕوا
بە شەرتێ تۆ لە من جارێک نەبی زیز

.٦١

جەنابی شێخ ئەگەر بینی ڕووەکەت
ئەبێ شێت و پەرۆشی تۆ و خووەکەت
منی «بێچارە» خۆ شێخ و مەلا نیم
ئەبێ چبکەم لە تاو هات و چووەکەت؟؟

.٦٢

خەمینم چون لە یادی من بە دوورە
خەمینی من لە بۆی چەژن و سوورە
ئەتۆ کەی عاشقی چاوم کە عاشق
لە سەر وادە و بەڵێنی زۆر جەسوورە

.٦٣

ئەمن پێکراو و کوژراوی مژۆڵم
هەمووی سوور بوو بە خوێن جێژوانی چۆڵم
ئەگەر دەرمانی زامانم نەکەی خۆت
گوڵم «بێچارە»م و یەکجار کڵۆڵم

.٦٤

دڵەی زارم وەها ئۆقرەی هەیە پێت
کە وا دایم ئەناڵێنێ لەبەرپێت
ئەوەندە دڵ ڕەق و لووت بەرزی دڵبەر
دەتارێنی دڵی دڵدار بە دووپێت

.٦٥

دڵــم وەک زوڵفــەکــەت لــوول و پەرێشــان
ژەم و دەم هـــەر دەنـــاڵێنێ لـــە ئێشـــان
هــەزار جــار مــن بــە قوربــانی خــودا بــم
کــە نەقشــی ڕشــت و هــەم بــاڵاتی کێشــان

.٦٦

لـــە هیجـــری تۆیـــە دڵ دایـــم پەرۆشـــە
لــە بــۆ وەســڵت دڵــی شــێتم بــە جۆشــە
بــەوەی شــادم کــە جارجــارێ لــە خــەودا
ئــــەبینم قامـــەتت دڵـــدار، چ خۆشـــە

.٦٧

لــە تــاوهیجرت ئەســووتێم چــاو بــە گریــان
لـــە وەســـڵتدا ئەترســـم بـــم بـــە بریـــان
مـــن و پەروانـــە خـــۆ دەردمـــان یـــەکێکـــە
ئەســووتێن هــەم لــە وەســڵ و هــەم لــە گریــان

.٦٨

کـــــوڵم بـــــادت ڕەفیقـــــی نـــــامورادیم
خەمی دووریت لـە جێگـەی کـەیـف و شـادیم
بـــە یـــادی تـــۆ ئـــەناڵێنم شـــەو و ڕۆژ
لــەرەی لەرزانــەکــەت هــەر دەم لــە یــادیم

.٦٩

ئەترسم دڵ ببێ ڕسوا لەبەر ڕێت
بە عەشقی تۆ منی «بێچارە» بم شێت
چ دڵ سەختیت و سەر ڕێگەم نەهاتی
لە سەر کام ڕێی دەبا من بێمە سەر ڕێت

.٧٠

گوڵێکم وا لە باخی وەسڵ چنیوە
ئەمن پێم وابوو عەشقم پێ تەنیوە
کەچی گوڵ وەک دڕوو ڕوو چوو لەچاوم
شەرابی لێو لە چاو تکتک وەریوە

.٧١

نەمامێکم لە باخی عەشقی تۆدا
زڕا ناوم لەگۆنای دەشت و کۆدا
بە دەس خۆتە ژیانم یا نەمانم
بکە تێرم لە ئاوی چۆمی خۆدا

.٧٢

ئەگەر من جووم ئەتۆ بمکە موسوڵمان
ئەخۆشی دەردی تۆم خۆت بمکە دەرمان
ئەگەر قابیل بەوەم وا ڕووت ببینم
دەسا وەعدێکی جێژوانت دە پێمان

.٧٣

ئـەمن کـێم تـا ئـەتۆ عاشـق بـە مـن بـی؟؟

لـە بـۆ وەسـڵت بسـووتم مـن لـە سـەرچی؟؟

ئـەڵێن تـۆ زۆر بـە ڕەحـم و دڵ بـەزەیـیت

لـە کـاتی مردنـا سـەر قـەبری مـن دی؟؟

.٧٤

ئـەمامێکت لـە دڵ دانـا بـە دوو چـاو

بـە غـەمزەی چـاو ئەگـەر نـەیـدەیتە بـەر ئـاو

ئـەبێ سـیس و بـە لاوی تێـک دەڕووخـێ

ئەمـە کـەی شـەرتی باخـداره بەڵـەک چـاو؟؟

.٧٥

لـە باسـی عیشـقی مـە، شـار بـوو بـە هـاوار

چلـۆن بـوو کەوتـە سـەر زاران، سـەد هـاوار؟؟

لـە کاتێـک‌دا نزیـک بـوو وەسـڵی ئێمـە

بـە پشـکۆی هیجـر و دووری بـووین گرفتـار

.٧٦

لـە بـەر عەشـق و ئـەوینی تـۆ بـە وەڵـڵا

لـە قـەوم و خـێش و خـەزمان بـووم تـەوەللا

ئەگـەر داوابکـەم ماچێـک لـە گۆنـات

بـە بـێ ڕەحمـی ئـەڵێی لاچـۆ، ئـەوەڵڵا

.٧٧

هــەموو گیــانم پــڕا و ســووتا بەڵــەک چــاو
ئەســیری زوڵفــی خــاوت بــووم زوڵــف خــاو
لــە بــەرچی خــۆت لــەمن زیــاتر ئــەزانی؟؟
بە جووت هەرکمان ئەبەیــن یــەک دوو میتــر جــاو

.٧٨

ئەپشــکێ لێــوەکــەت قــەن لێــی ئــەبارێ
بــرینم پــڕ نمــەک دەکــرێن بــە جــارێ
بــــڕۆ؛ تیــــری مژۆڵـــــت کــــار مەهێنـــــە
کــە کــوژراوم بــە لەنجــەی دوو هــەنارێ

.٧٩

خــەم و مــەینــەت بــرامن دوو بــرای چــاک
بــەڵێنیان داوە مــن هــەرگیز نــەبم تــاک
عەجــەب ســوورن لەســەر وادە و بــەڵێنیان
لەگــەڵ مــن‌دان هــەتاکوو دەچمــە ژێــر خــاک

.٨٠

بــەڵێنت‌دا کــە بــێ بــۆ لام گــوڵی جــوان
نــەهاتی و هــەر شــکاندت عەهــد و پــەیمــان
هــەزار جــاری تــریش بشــکێنی وەعــدەت
بــە هیــواتم بــە تــەنیایی لــە جێــژوان

.٨١

ئـەتۆ شـەم بـێ منـیش پەروانـەکـەی تـۆم
ئـەتۆ لـەیـل بـێ منـیش دێوانـەکـەی تـۆم
ئـەتۆ چـی بـێ منـیش بۆتـۆم دڵـە گیـان
کـە قـومری بـێ منـیش هێلانـەکـەی تـۆم

.٨٢

لەگـەڵ مـن دا فەلـەک هـەر خـوار و چەوتـە
خـەمی پـێ دام وتـی هـا نـانی شـەوتە
قـوڕ و لیتـە و تـەوەن[١]، لێفـە و سـەرینم
وتـی ئـەم جێگـە نەرمـەیش شـوێنی خەوتـە

.٨٣

بـە گۆشـەی چـاوەکـەت لێمـان کـە چـاوێ
بـە دەنگـە خۆشـەکـەت لێمـان کـە قـاوێ
لـە زسـتانی جیـایی دا ڕچـاوم
ڕوخـت تـاوە کـەسـم لێمـان کـە تـاوێ

.٨٤

لـە سـەرچی بـوو لـە مـن تـۆرای زەمانـە؟؟
لـە بـەرچی بـوو کـەوا گـۆڕای زەمانـە؟؟
لـە بـۆ دەردی هـەزاران چارەسـەربووی
کـە گـەیـە مـن لـەبۆچ دۆڕای زەمانـە؟؟

---

١- تەوەن: بەرد.

.٨٥

ئەمن چ بکەم لە دەس بەردناشی گەردوون
بە گەڕیانی گوڵی هیوام ئەکا توون
فراوانن لە دنیادا وەکوو من
لەبۆ «بێچارە» بۆ سوورە لەسەر چوون

.٨٦

بە زوڵفە خاوەکەت دڵ بوو گرفتار
بە تیری چاوەکەت دڵ بوو بریندار
ئەسیرت کردم و جەرگت بڕیوم
ئەمە کەی شەرتی دڵدارە، ئەویندار

.٨٧

ئەمن مەجنوون و ئەو نازدارە لەیلە
لە بۆ وەسڵی دڵی «بێچارە» کەیلە
هەموو عالەم دەزانن بۆی نەماوم
کەچی ئەو شۆخە بۆم خاڵی لە مەیلە

.٨٨

خەفەت بۆچی ئەتۆ لاتدا لە بڕیار
لە بۆ جێت هێشت دڵی شێتم بە بێ یار
قەرار بوو تاکوو هەین پێکلو بمێنین
لە من باشتر بڵێ کێت بوو بە کڕیار

.٨٩

لـە دووریـت چـاوەکـانم بـوون بـە ئەسـرین
دڵـی شـێتم ئـەوا کەوتـە گـڕ و شـین
نـە گریـان و نـە ناڵـەم بـاش ئەناسـی
هـەمووم ناسـی بـە لوتفـت یـاری چاوشـین

.٩٠

بـە زوڵفـت عالـەمت خسـتە کەمەنـدت
ئـەناڵێنن هـەموو عالـەم لـە بەنـدت
چ بـێ بـاکی، لـەبۆ ڕاو چەنـدە سـووری
دەکـەی عالـەم ژەهرخـوار تـۆ بـە قەنـدت

.٩١

لـە بـەر کـوڵمی سـپیت هەڵنایـە چـاوم
بـە دووچـاوی ڕەشـت سـووتا هـەناوم
مـەکـە، لاچـۆ هـەموو گیانـت بەڵایـە
بـە موژگانـت هـەموو لـەش دابـڕاوم

.٩٢

بـە بـێ تـۆ ژینـی مـن سـەرجەم بەتاڵـە
لـە عەشـقی کوڵمـەکـەت دڵ کەوتـە ناڵـە
بـە غـەمزە و لەنجـە «سـەرمەس»ت گێـژ و وێـژە
لـە پێنـاوم دڵیشـت کـرچ و کاڵـە

.٩٣

بە سیلەی چاوی تۆ بەربوو شەرارە
لە گیانی پڕ لە خاری ئەم هەژارە
وتت بێ دینە هەرکەس بێ بەڵێنە
کەچی ناکەی وەفا بەم گەستە مارە

.٩٤

لە دووری تۆ دڵم خوێنی ڕژاوە
دڵم هێزی سەبووری لا نەماوە
هەموو عومرم لە ڕێی تۆدا فەنا بوو
وەرە با بۆن بکەم ئەو زوڵفە خاوە

.٩٥

لە هیجری تۆیە چاو فێربوو بە گریان
هەتاکەی من ئەسووتێنی بە هیجران
دەڵێن مەعشووق لە بۆ عاشق بە ڕەحمە
کەچی «بێچارە»کەی خۆت کرد بە بریان

.٩٦

لە ڕێی عەشقت جوانیم دا بە پیری
ئەوا مردن بە هێندی دێت بە پیری
بژیم، بمرم، لە جەننەت یا لە دۆزەخ
بە چاوانت گوڵم تۆم هەر لە بیری

.٩٧

بەشارت بێ دڵە ڕۆژی ویساڵە
هەموو ڕۆشتن شەوانی دەرد و ناڵە
بڵێی وابێ منی «بێچارە» پێت گەم
بە چاوانت هەمووی خەونە و خەیاڵە

.٩٨

دووچاوی من لە تاوی تۆ وەکوو تەیر
بە مەجنوونی لە هەرد و کۆ دەکا سەیر
ئەمن بۆ تۆ لە ژیندا هەڵوەدا بووم
ئەتۆیش بێ خەم لە سەیرانگا ئەکەی سەیر

.٩٩

بە زوڵفی تۆیە شەو تاریک کە دادێ
ئەگەر وایە چ خۆشە شەو دەبابێ
شەوی تاریک و بەی گووشین چ خۆشە!
بە هیواتم منی «بێچارە» سا بێ

.١٠٠

دەبا بمرم ئەوینت چێتە ژێر گڵ
ئەگەر لاشەیش بتۆرخێ تۆی لە ناو دڵ
دڵی من پڕ لە عەشقی تۆیە چاو ڕەش
ئەبێ وابێ دڵێ دەرچێ لە ناو گڵ

.١٠١

لـه بـەرچی ئـەو دڵـەی تـۆ لـێم بـە قینـە
لـە بـۆ «بێچـارە» کوشـتن زۆر بـە تینـە
لەبـەر چـی دەرئەکـەی حـوکمی نـەمانم؟؟
گونـاهی مـن بـە تـەنیا هـەر ئەوینـە

.١٠٢

لـە تـاو دووریـت دڵـم کـون بـوو وەکـوو نـەی
دڵـی زامـم دەنـاڵێنێ پـەیاپـەی
خـۆمم بیرچـوو لـە تـاوی عەشـقی تـۆدا
منـی «بێچـارە» خـۆم بیرکـەم هەتاکـەی؟؟

.١٠٣

چ خۆشـە ئـەو بـەیانـەی چـاو هـەڵێنم
لـە کۆشـی نـەرمی تـۆدا سـەر دەرێنم
خـەیـاڵێکی چ خۆشـە، چـەن بـە دوورە
هـەتا ئـەو ڕۆژە مـن داخـۆ نـەمێنم؟؟

.١٠٤

ئـەتۆ شـیرین ئـەمن فـەرهادی کۆکـەن
ئـەوا مـن گـڵ ئـەتۆ نێرگیـز و سۆسـەن
لـەرەی مـەمکت، بـزەی لێـوت، قـژی خـاو
لـە بـۆ سـۆمای دووچـاوم بـوون بـە سۆسـەن

.١٠٥

جــوانی مـــن بـــه پیـــری ڕۆیـــی لـــه داخـــا
بـــه ڕۆخســـار نـــه، ئـــه‌من پیـــر بـــووم لـــه ناخـــا
له داخـی چـی؟ لـه داخـی چـه‌رخی گـه‌ردوون
منـــی «بێچـــاره» بـــێ گـــوڵ بـــووم لـــه باخـــا

.١٠٦

گـــوڵی سۆســـه‌ن لـــه‌کـــێ پرســـم هـــه‌واڵت؟؟
له‌گـــه‌ڵ کـــێ‌دا به‌شـــت کـــردوه جـــه‌ماڵت؟؟
ئه‌تۆ بێ خه‌م نه‌کـه‌ی سـه‌بـر و سـه‌فا و گه‌شـت
منـــیش هـــه‌رده‌م ئـــه‌ناڵێم بـــۆ ویســـاڵت

.١٠٧

دووچـاوی مـن بـه وێنـه‌ی دوو په‌ڵـه‌ی هـه‌ور
لـــه بـــۆ بـــارین ئـــه‌ناڵێنێ بـــه بـــێ ســـه‌ور
ئه‌گـــه‌ر داکـــا هـــه‌موو عالـــه‌م ده‌مـــاڵێ
بـــه نـــاڵین دێنـــه ســـه‌ر دیـــنم هـــه‌زار گـــه‌ور

.١٠٨

دڵـــه «بێچـــاره» کـــه‌م بـــێ تـــۆ کلۆڵـــه
هـــه‌موو گیـــانم نیشـــانه‌ی دوو مژۆڵـــه
هـــه‌زار جـــارت وه‌عـــد پێـــدام بـــه وه‌ســـڵت
کـــه‌چی کۆشـــم ئه‌مێســـتایش گیانـــه، چۆڵـــه

.١٠٩

دڵــم «بێچــارە» بــوو بــەو دانــە خاڵــە
ئــەتۆیش بــانگم دەکــەی هــا چــۆنی خاڵــە
ئــەمن خــاڵ نــیم و شــەیدای خــاڵی لێــوم
دەوای دەردم مژینـــــی لێـــــوی ئاڵـــــە

.١١٠

فەلــەک یــاخوا بشــێوێ چــەرخ و دەورت
ئــەمن «بێچــارە» بــووم، تــۆقیم لــە ســەورت
لــە گێــژاوی ژیــان تــا کــەی بســووڕێم
حەســاوم کــە بــە وێنــەی قــەومی گــەورت

.١١١

بــە خێرهــاتی گــوڵم ســەر هــەردوو چــاوم
لــە هیجــری تۆیــە مــن ســووتا هــەناوم
بــە بینینــت بــەجارێ دێمــە ســەر خــۆ
ئــەتۆ تــاو، مــن گــوڵێکی ســیس و خــاوم

.١١٢

وتــت: بــۆ کوشــتنی تــۆ زۆر جەســوورم
لــە دڵ ڕەحمــی و بــەزەیی بــۆت بــە دوورم
ئەگــەر عاشــق لــە بــۆ یــاری نــەمردبا
درووس وابــوو لــە زوڵمــی وا نــەبوورم

.١١٣

لــــه دەســــتی شـــینی مـــن دنیـــا هەراســـه
ئـــەیـــان پرســـی لـــه بـــۆ ســـاتێ چ باســـه؟
ئـــەوەی وەعـــدەی وەســـڵ بـــوو پـــاک درۆ بـــوو
پـــێیـــان وابـــوو دڵـــم گیســـکی هـــەیاســـه

.١١٤

چییـــه چـــارەی منـــی «بێچـــارە» بـــێ تـــۆ
مـــنم مەجنوونـــەکـــەی وێڵـــی کـــەژ و کـــۆ
ئەوەنـــده شـــیوەنم کـــردوه لـــه دووریـــت
دووچـــاوم، چـــاوەکـــەم نـــەیمـــاوە هـــیچ ســـۆ

.١١٥

وەکـــوو یوســـف ئەســـیری بیـــری چـــاوم
لـــه تـــاو عەشـــقت نـــەما هێـــزی هـــەناوم
لـــه دارم دەی بکـــەی لـــەت لـــەت دڵ و گیـــان
لـــه ســـەر وادە و بـــەڵێنم بـــووم و مـــاوم

.١١٦

دوو چاوی پڕ لـه سێحر و زوڵفی چین چین
ئەســـیریان کـــردم و مایـــل بـــه مـــن نـــین
عەجـــەب مـــاوم چ ســـڕێکه لـــه بـــەینـــا؟
بـه کـەیف و شـادی ئـەو کاتـەی ئـەکـەم شین

.١١٧

لــە هیجــرت چــاوەکــانم ســۆی نــەماوە
بــە چاوانـــت قەســـەم جـــەرگم بـــڕاوە
چ بــێ رەحمــی ئــەتۆ جــەرگت بڕیــوم
لــە بــۆ وردی دەکــەی هەرعــەینــی قــاوە

.١١٨

ئــەمن دیــل و ئەســیری داوی خــەم بــووم
ئــەمن خنکــاوی ئــاوی هــەر دوو چــەم بــووم
هەموو عالەم خــەریکی عــەیش و نــۆش بــوون
منــی «بێچــارە» کێــوی ســەر بــە تــەم بــووم

.١١٩

چییــە چــارەی منــی «بێچــارە» بــێ تــۆ
بــەرەو کــوێ چــم منــی ئــاوارە بــێ تــۆ
ئەگــەرچی مــن لــە ئــەم شــارە بــە نــاوم
غــەریبم مــن لــە نــاو ئــەم شــارە بــێ تــۆ

.١٢٠

ئــەتۆ نــوقلی و دڵــی مــن عــەینــی مێشــە
تــەوەللا بــووم لــەوەی وا خــزم و خێشــە
گــوڵم مــردم ئــەوەن هــاتم بــە دووتــا
ژیــانم چــوو بــە دووتــا بەســیە کێشــە

.١٢١

لــه كاتێــكدا كــه تــۆم بینــی بــه چــاوان
لــه بــۆ تــۆ بــوو دڵــه گیــان هــەر دوو چــاوان
منــی «بێچــاره» بــووم بــه خــادمی تــۆ
ئــەوەی فــەرمووت وتــم ســەر هــەر دوو چــاوان

.١٢٢

کــه تــۆم ناســی لــه دنیــا دەربــەدەر بــووم
ســەراپا شــێت، لــه عالــەم بێخەبــەر بــووم
وەهــای گرتــووم لــه ئــامێز دەرد و مــەینــەت
لـــه مێـــژه کـــه وا بـــابی کەســـەر بـــووم

.١٢٣

هــەر ئــەو ســاتەی کــه تــۆم بینــی بــه دوو چــاو
لــه جــەرگی مــن تکــی هــەم خــوێن و زووخــاو
دەیــان ســاڵه لــه بــۆ ماچێــك ئــەناڵم
ئەوەنــده دڵ رەقــی نــەتگوت بــەســەر چــاو

.١٢٤

لــه خەنــده و پێکــەنینی مــن بــه قینــه
هــەموو ئــاواتی خــوێنی مــن مژینــه
له ســەر چــی لێم بــه قینــه یــاری چــاو مەســت
ئــەدا حــوکمی نــەمانم بــەو جەبینــه

.١٢٥

هەتاکەی هەر ئەناڵی مەستی سەرشێت؟؟
لە بۆ کێ جەرگی تۆ بۆسۆی لە بەر دێت؟؟
ئەتۆ بۆ ئەو بڕاوە هێزی ئەژنۆت
کەچی بەم حاڵەتەی تۆ ئەو گەمەی دێت

.١٢٦

کوڵی سوورم وەرە بۆ تۆ بە تاوم
لە پاش هیجرت دەچۆڕێ خوێن لە چاوم
بەڵێن وابوو بە دڵ بەد کار پسێنین
ژیانی من لە بۆ تۆیە هەناوم

.١٢٧

هەتاکەی هەڵوەرێنم خوێن بە ئەسرین
بڕاوە لەو هەناوم هێز و هەم تین
دەکێشم دەردی عالەم من بە تێکڕا
بە ئاواتم کەوا ڕۆژێک بە یەک بین

.١٢٨

بە زوڵفی خاوی تۆ دیل بووم لە ناکاو
دڵی شێتم دەکەی جن جن بە پڕ تاو
لە داوی عەشقی تۆدا مەرگ چ خۆشە
نەوەک دایم لە هیجرانت کوڵ و تاو

.١٢٩

ئـەمن تاکـەی خـەم و مـەینـەت بچێـژم؟؟
هەتاکـەی بـەو دڵـەم خوێنـاو بڕێـژم؟؟
بـە ئـاواتم ئەگـەر ڕۆژێـک لـە سینەت
خـەم و دەردم بـە تێکڕایـی بنێـژم

.١٣٠

یەکـەم ڕۆژ هـەر نەتم‌دیبایـە بریـا
بـە ناسـینت دووچـاوم بـوون بـە زەریـا
بـە چاوانـت دڵـم سـووتا بـە جـارێ
بـە وێنـەی قاوەتـاڵ سـەر گـڕ کـە نریـا

.١٣١

لـە پێنـاوی لەشـی چـەرمووی وەکـوو دوڕ
ئـەوەن هـاتم کـە لـەش فـەوتا و نـەما گـوڕ
منـی «بێچـارە» خـۆ مـردم لـە عەشـقت
بڵـەی کـێ بـێ کـە بیپێـوێ لـە بـۆم قـوڕ؟؟

.١٣٢

لـە بـێ مـەیلیـت هـەموو عـومرم فـەنا بـوو
بـڕۆ چێتـر کـە عەشـقی تـۆم لـە بیـر چـوو
ئـەتۆ عاشـق نـەبووی «بێچـارە» ئـەینـا
چلـۆن عەشـقێک لـە بیـر دەکـرێ وەهـا زوو

.١٣٣

هەتا کەی بێ وەفایی ئەی جەفا کار
لە بێ مەیلیت سەدان کەس کەوتە هاوار
لە سەر وادە و بەڵێن جارێک جەسوور بە
کە بۆ جارێک بە تۆیش بێژن ئەویندار

.١٣٤

لە بێ لوتفیت هەموو ژینم پڕاوە
لە کاسەی چاو گەلێ ئەسرین ڕژاوە
ئەوین و عەشقی بێ مەینەت درۆیە
منی «بێچارە» ڕازیم بەم حەساوە

.١٣٥

لە تاو دووریتە من ڕەنگم پەڕیوە
خەمی دووریت تەواو هۆشی دزیوە
گومان ناکەم لە وەسڵیشت ببم شاد
کە وا مەینەت هەموو دڵمی تەنیوە

.١٣٦

فەلەک دەستم بە داوێنت هەتاکەی
بناڵێنم لە تاو لەنجە و لەرەی بەی
بە موژگانی دوو چاوی، دڵ برینە
برینی چی؟ هەمووی کون بوون وەکوو نەی

.١٣٧

گـــوڵم لـــه کـــوێی هـــەتا بێمـــه ســـڵاوت
بکـــەم بـــۆنی لەشـــی بـــۆن وەک گـــوڵاوت
بـــه چاوانـــت قەســـەم بـــۆ تـــۆ ئەســـووتێم
پەپوولـــەم بـــا بســـووتێم پێـــی هـــەناوت

.١٣٨

لـــه بـــۆ وەســـڵت ئـــەناڵێنم دەمێکـــه
جـــەفا تـــا کـــەی گـــوڵم ژینـــه و دەمێکـــه
لـــه وەســـڵیش‌دا خـــەمی هیجـــران گرانـــه
خـــەمی دووریتـــه باشـــه هـــەر خەمێکـــه

.١٣٩

ئـــەوەی مـــن دیـــم لـــه ســـیلەی چـــاوی تـــۆدا
دەبـــێ ئـــاواره بـــم هـــەردەم لـــه کـــۆدا
لـــه دوو چـــاوم بـــه خـــوڕ ئەســـرین دەبـــارێ
وەکـــوو ئـــاوی بـــەهاری دێـــت بـــه جـــۆدا

.١٤٠

وەره ســـاقی شـــەرابی خـــەس دە تێکـــه
ســـەرم گێـــژی خـــەیاڵاتـــه دەمێکـــه
خـەم و مـەینـەت لـه دووری یـار هـەتا کـەی
بـه ســـەر خۆشـــی بـــژین ژینـــه و دەمێکـــه

.١٤١

بە بینینت بڕینم پڕ نمەک بوو
خەمی دووریت لە ناو سینەم کەڵەک بوو
ئەگەر جارێک لە ئامێزت بکێشم
بەهەشت و کەوسەری خوام ناگەرەک بوو

.١٤٢

لە ناو دووریت گەڵای ژینم وەریوە
گوڵم کاسەی تەمەن وا هاتە نیوە
جەفا تاکەی ژیان کورتە و دەمێکە
فەلەک خوێنی هەزارانی مژیوە

.١٤٣

ئەگەر بۆم دەرکەوێ زوڵف لوولی چاو کاڵ
بە قوربانی دەکەم گیان و سەر و ماڵ
شەرابی خەست و مەیخانە حەرام بێ
لە بۆ سەر خۆشی دەمژم ڕوومەتی ئاڵ

.١٤٤

بە بینینی ئەمن بۆچ وا پەشێوی؟؟
لە ئەم «بێچارە»یە بۆچ وا بزێوی؟؟
ئەگەر تۆزتۆ بکەی سینەم بە تێکڕا
بە تەنیا ناوی تۆیە وا لە نێوی

.١٤٥

هـەر ئـەو کاتـەی ئـەبینم بـەژن و بـاڵات
گرفتـارم لـە بەنـدی زوڵفـی ئـاڵات
هـەموو دنیـا بـدەم بـۆ وەسـفی جوانیـت
کەمـە گیانـە، بـە نـرخن گیـان و کـاڵات

.١٤٦

هـەموو شـەو چـاوەکـانم پـڕ لـە شـینە
گـڕی سـینەم گـەلێ بـەرز و بـە تینـە
ئـەتێم لێـک چـاوی پـڕ خـوێنم کـە بـەڵکوو
ببیـنم خـاوەنی ئـەو چـاوە شـینە

.١٤٧

خـەیـاڵی تـۆم دەوام هـەر وا لـە دڵدا
لـە یـاد نـاچێ مەگـەر ڕووچـم لـە گـڵدا
دڵـم وەک بولبولێـک بـۆ وەسـڵی بـاڵات
ئـەناڵێنێ و دەکـا هـاوار لـە چـڵدا

.١٤٨

لـە بـۆ مـەرگم دوو چـاوت دیـارە سـوورە
یـەکـەم هیـوات کـە جۆگـەی خـوێنی سـوورە
دەبـا وابـێ، گـوڵم سـەر وا لـە ڕێتـدا
گـەریش ئـازار ئـەبینی لـێم بیـوورە

.١٤٩

گرفتـــــارم بـــــه دەردی دڵ گرفتـــــار
ئـــەناڵێنم لـــە دەس چـــەرخی جـــەفا کـــار
لـــە نـــاڵێنم هـــەموو عالـــەم وەرەس بـــوون
منـــی «بێچـــارە» هـــەر خـــۆت بمکـــە تیمـــار

.١٥٠

ئەپرســـــی حاڵـــەکـــەم، حـــاڵم خـــراوە
بـــە دووری بەژنـــەکـــەت هۆشـــم نـــەماوە
کـــە رۆیشـــتی و منـــت جێ‌هێشـــت دڵـــە گیـــان
دڵـــــی بـــــرژاوی «بێچـــــارە»م بـــــڕاوە

* * *

# چریکەی دڵ ٧

(سەرمەس)

لەگەڵ مندا فەلەك هەرخوار و چەوتە
خەمی پێ دام وتی ها نانی شەوتە
قوڕ و لیتە و تەوەن لێفە و سەرینم
وتی ئەم جێگە نەرمەیش شوێنی خەوتە


ISBN:978-622-99232-8-3

